# گرافیک دیزایین چییە و گرافیک دیزایینەر چ کارەیە؟ لق و پۆپەکانی گرافیک دیزایین چین؟




ڕەنگە بتەوێت و ئارەزووی ئەوەت هەبێت ببیت بە گرافیک دیزاینەر، لەوانەیە دیدەنییێکی باشت هەبێت بۆ ڕەنگ و شێوەکان وهەڵبژاردن و خۆشەویستیەکی زیاتر بۆ فۆنتەکان. سەرباری ئەوە تۆ ڕاڕا و دوودڵیت ئایا گونجاویت بۆ ئەم کارە و لە هەمان کاتیشدا پیشەی گرافیک دیزاینت وەکو هەڵبژاردنێکی کرداریانە و گونجاو دێتە پێش چاو! بەهەر لایەک بێت تۆ لەسەر ئاراستەیەکی باشیت و لەگەڵمان بە بۆ ئەوەی وەڵامی چەند پرسیارێک بدەینەوە و تۆ و هاوشێوەی تۆش لە ڕاڕای و دوودڵی وەدەربنێین.

زۆرینەی خەڵکی گرافیک دیزاینەران دەخەنە هەمان پۆلی هونەرمەندانی هونەرە جوانەکان لەکاتێکدا ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە کە گرافیک دیزایینەران دەکەونە پۆلێکی تەواو پێچەوانە لە هونەرمەندانی هونەرەجوانەکان. هونەرمەندان شتانێک دەکەن بۆ سرووش بەخشین و هەست جوڵاندن و ئەوان شتانێک دەکەن کە بەشێوەیەکی بێ هاوتا دەستکردی خۆیانە و دەیانەوێت لەگەڵ جیهان هاوبەشی پێ بکەن و بەمەش باشترین هونەر وا لە هەر بینەرێک دەکات خویندنەوەی خۆی بۆ هونەرەکەی هەبێت. بەڵام هەرچی گرافیک دیزایینەرە شتانێک دەکات بۆ گفتوگۆ و پەیوەندی دروستکردنە. – گرافیک دیزایینەران چارەسەری بیرکردنەوە دیدەنییەکان دەکەن و ئەگەر خەڵکی بە شێوە بێهاوتاکانیان پەیامەکانی ئێمە لێکبدەنەوە ئەوە کەواتە ئێمە لەکارەکەمان زۆر باشنین!

**ئێستا کاتی ئەوەیە وەڵامی پرسیارە گەورەکە بدەینەوە ئەویش ئایا گرافیک دیزاینەر چ کارەیە؟**

فەرموو ئەوە وەڵامەکەیەتی بەبێ ئەولا و ئەولا کردن کە گرافیک دیزایینەران پێگەیێنەری دیدەنی و بینایین(visual communicators) . ئەوان ڕێنماییان پێدەدرێت کە باس لە کێشەیەک دەکات بۆ ئەوەی چارەسەر بکرێت یان دەرئەنجامێکی دیاریکراو کە دەبێت بەدەست بهێندرێت و بۆ ئەم مەبەستە گرافیک دیزایینەران زانیاری کۆدەکەنەوە و شیکردنەوە ولێکدانەوەی بۆ دەکەن بۆ دۆزینەوەی باشترین ڕێگەچارە، و سەرکەوتنی ئێمە وابەستەیە بەو دەرئەنجامەی ئێمە دروستمان کردووە نەک تەنها بەوە وابەستە بێت کە چەندە جوان خۆی دەنوێنێت.

بەشە خەندە ئامێزەییەکەی گرافیک دیزایینەران ئەوەیە ئەوان دەتوانن هەرچی هۆی ڕاگەیاندنی بینراوبێت دەتوانن بەکاریبهێنن بۆ گەیاندنی پەیامەکەیان. گرافیک دیزایینەران شێوە و ڕەنگ و فۆنتەکان لە دیزایینی چاپکراو و ماڵپەڕەکان و میدیای کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن. هەروەها ئەوان دەتوانن فۆتۆگرافی و جوڵە واتە ئەنیشمەیشن بەکاربهێنن! تەنانەت، ئەوان دەتوانن تەختەی ئاگادارییەکان و دیوارەکان و ڕووی بیناکان بەکاربهێنن. ئەمە جگە لەوە دەتوانن ئاڵا و باڵۆن و ئاماژە دوکەڵییەکانیش بەکاربهێنن ئەگەر بیانەوێت.

بۆ ئەوەی بڕیارەکە بە ئاسانی بدەیت ئەوا من لێرە باسی چەند شتێک دەکەم کە پێویستە چی بکەیت و چی نەکەیت کاتێک ویستت ببیت بە گرافیک دیزاینەر. سەرەتاش بەوە دەستپێدەکەم پێویستە چی نەکەیت.

## ١- پێویست نییە لە وێنەکێشان زۆر باش بیت بەڵام ئەگەریش بوویت ئەوا باشترا!



هونەر ڕەگەکەی بەهرەیەکی زماگماکییە لەکاتێکدا دیزایین لێزانیین و کارامەییە و وەکو هەر لێزانین و کارامەییەکی تر. تۆ وەکو دیزایینەر، سنوردار نەکراویت لە بازنەی بیرکردنەوە و لێزانی و کارامەییی خۆتدا بەڵکو تۆ خۆت دەبینیتەوە و کۆمەکی دەکرێیت لەلایەن هونەرمەندان و ئەنیمەیتەران و هەرچی پیشەی ناو ئەو هاوکێشەیە لەسەر پڕۆژەکانت. سەبارەت بەوەی کە پێویست نییە لە وێنەکێشان زۆر باش بیت ئەوا بەهەڵە لێم تێمەگەن بەڵکو ئەگەر بتوانیت بکێشیت ئەوە هەر زۆر باشە بەڵام دووبارە دەڵێم شتێکی پێویست نییە بۆ بوون بە گرافیک دیزایینەر. با نمونەی خۆمتان پێبڵێم، توانای من لە وێنەکێشان و هێڵکاریدا تەنها لە شتێکی سەرەتای خۆی دەبینێتەوە بۆ نمونە ڕاکێشانی چەند هێڵێک بۆ یەکتری دروستکردنی وێنای ئەو شتەی من دەمەوێت لەوە زیاتر نازانم مەگەر خۆم زیاتر هەوڵبدەم! بەڵام ئەوەمان لەیادبێت کە کێشانی شتەکان و وێناکردنیان بەشێوەیەکی بینراو ئەوە باشترە و زیاتر هاریکارت دەبێت، ئەمانەش بەئاسانی لە دەفتەری تێبینییەکانت یان پەڕی گەورەی وێنەکێشان بیانکێشیت و وێنایان بکەیت. بۆ نمونە من خۆم حەزدەکەم پێش ئەوەی بڕۆمە سەرکۆمپیوتەر وێنای شتەکە بکەم و بیکێشم جا لۆگۆبێت یان نەخشەی شتێک بێت لەسەر کاغەزێک یان ئەو دەفتەرەی تایبەتم کردووە کە ئەمە ڕێگە پەسەند و تاقیکراوە و متمانەپیکراوەکەیە و کە بەبڕوای من کاتێکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا چەندان دیزاینەریش هەیە کە بیرۆکەکانیان ڕاستەوخۆ دەبەنە سەر کۆمپیوتەر و لەوێ وێنای ئیشەکەیان دەکەن و هەر لەوێ کارەکەیان تەواو دەکەن.

**٢ –پێویستت بەهیچ بڕوانامەیەکی وەکو بەکالۆریۆس یان ماستەر یان دکتۆرا نییە بۆ ئەوەی ببیت بە گرافیک دیزایینەر بەڵام ئەگەر هەبوو ئەوا باشتر!**



ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت کە نابێت تۆ یەکێک لەو بڕوانامانەت هەبێت بەڵکو ئەگەر تۆ وا نزیکە خوێندنەکەت تەواوبکەیت ئەوا بڕوانامەیەک لەبواری دیزایین ڕێگەت بۆ خۆش دەکات کە چەندانی تر ببینیت و کاربکەیت و گوێ بگریت بۆ دیزایینەرە بەناوبانگەکان و چەندان هاوڕێی دیزایینەری تریش. و هەروەها ڕێگەت بۆ خۆش دەبێت بۆ دەست گەیشتن بە سەرچاوە بێ سنورەکانی دیزایین و ڕێنماییە بەسوودەکانی مامۆستاکانیش لەولاوە بوەستێتەوە. ئەمە هەرچەندە زۆربەی زۆری دیزایینەرە بەناوبانگەکان هەرگیزا و هەرگیز نەچوونەتە کۆلێژ و سکوڵ و قوتابخانەی تایبەتی بوارەکە بەڵکو کارەکەیان بە تێپەربوونی کات و ڕاهێنان کردن فێربوونە و پسپۆڕی خۆیان بە خوێندنەوەی پەرتووکەکانی بواری دیزایین و کارکردن لەگەڵ دیزایینە بە ئەزموونەکان وەرگرتووە. گرنگرتین شتیش ئەوە بووە کە لە بوارەکە کاریان کردووە مەبەست بەوە ئەوە نەبووە تەنها خۆیان لەماڵەوە کاری گرافیک دیزایین فێربووبن بەڵکو بەدەر لەوە لە شوێنێک وەکو دیزایینەر کاری کردووە و کارەکانی بەکارهاتوون و نمایشکراون بۆنمونە خۆم لە دەزگایەکی ڕاگەیاندن کاردەکەم و بەوەش زیاتر ئەزموون وەردەگرم .لەبەرئەوە و لە ڕاستیدا ئەوەی تۆ پێویستە بیکەیت بۆئەوەی ببیتە گرافیک دیزایینەرێکی سەرکەوتوو ئەوە مەشق و ڕاهێنانە بەشێوەیەکی بەردەوام. سەرچاوەی باشی ڕێنمایی بدۆزەرەوە و باشترین ڕاهێنان و مەشقەکانی دیزایین بۆخۆت دیاریبکە و دواتر جێبەجێیان بکە و دووبارە و سێبارە هەتا ئەو کاتەی ئاستت دەگاتە ئاستی باش بوون.

لەڕاستیدا بەهۆی نەبوونی کۆلێژ و سکوڵی تایبەت بە دیزایین لە کوردستان کەم لە ئێمە بیر لە ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنانە دەکەینەوە بەڵام زۆرجاریش هەیە دەڵێین ئەگەر لە شوێنیکی تایبەتمەند بەو بوارە خوێندبام ئەوا ئێستا دەمتوانی ببمە گرافیک دیزایینەر بەڵام بیهێنە پێش چاوی خۆت و ئەگەر تۆ لە شوێنی ئەهلی بە پارەیەکی زۆر لەو بوارە خوێندن و مەشق بکەیت و ٣ بۆ ٤ ساڵ خەریک بیت تا بڕوانامەیەک وەربگریت لەبواری دیزایین، پێت وانییە کاتێکی زۆرە؟ بەڵێ بەدڵنیاییەوە زۆرە و هەرچەندە وەرگرتنی ئەم بڕوانامەیە زیانت پێناگەیەنێت بەڵام لەڕاستیدا ئەگەر خۆت ببیتە فیرکاری خۆت ئەوا زیاتر جەخت لەشتەکان دەکەیتەوە و زیاتر کاریگەر و بەبەرهەم دەبیت و شانازیش دەکەیت کە گشت شتەکان خۆت بوویت و کەس نەبووە ببێتە فێرکاری سەرەکی تۆ!

باشترین ڕێنمایی لە برای خۆتانەوە بۆ ئێوە ئەوەیە کە سەرەتا گوێ بگرن پاشان ئیشەکە بکەن. بە دەیان پەرتووکی بواری دیزایین بەزمانی ئینگلیزی و عەرەبی هەن بەداخەوە بە زمانی کوردی کەمن و پڕن لە ڕێنمایی ناوازە و نمونەی نایاب لە دیزایینەرە بەناوبانگەکانەوە بەڵام ئەگەر تۆ ئارەزووی خوێندنەوە ناکەیت ئەوە دەیان و سەدان گوتار و سیمینار و ۆرکشۆپ لەسەر ئینتەرنێت بەردەستن و

لە باشترینەکان خۆت فێربکە و پاشان بنەماکانیان جێبەجێ بکە و دواتر لەسەر کارەکانی خۆت تاقیان بکەوە.

دواجاریش بیرت بێت کاتێک کۆمپانیایەک یان هەر ڕێکخراو و تەلەفیزیۆن و کەس و لایەنێک بیەوێت کارێکت پێ بکات ئەوە ئەوەی زۆر گوێی پێنادات بڕوانامەکەتە بەڵکو ئەوان سەیری کارەکانت دەکەن تا چەند پێشکەوتوو و مۆدێرن و کاریان لەسەر خەڵک هەبووە!

**٣- ئەمجار بابێینە سەر کۆمپیوتەر، پێم وا نییە پێویست بێت هەر لەسەرەتاوە هەزاران دۆلار لە کۆمپیوتەرێکی خەیاڵی خەرج بکەیت!**

لەکاتێکدا ئێمەی دیزایینەران ئای ماک و ماکبووک پرۆ یان هەر کۆمپیوتەرێکی تری توانست بەرزمان زۆر لەلا خۆشەویستە بەڵام کە تۆ سەرەتاتە و تازە دەتەوێت دەست پێبکەیت ئەوا لە کۆمپیوتەرێکی مامناوەندەوە دەستپێبکە. من وەکو خۆم لەسەر کۆمپیوتەری وەها گرافیکم کردووە ڕامەکەی ١ گێگابووە و پرۆسێسەرەکەی کۆر ٢ دیۆ و پێنتێۆم ٤ و ئەو جۆرانە بووە ئەمە هەرچەندە باشترین و گونجاوترینیش نەبوو بۆ من بەڵام توانیشمان کاری لەسەر بکەین و بگەینە ئەمڕۆ! ڕاستی بەگوێرەی ڕۆیشتنی کات و بەرزبوونەوەی توانستی خۆت پێویستت بە کۆمپیوتەری توانست بەرز دەبێت بۆ نمونە ئەگەر کارەکەی تۆ بریتییە لە کاری گرافیکی جوڵاو و سێ ڕەهەندی و کاری ئەنیشمەیشن و مۆنتاژی باڵا ئەوا بەدڵنیاییەوە پێویستت بە کۆمپیوتەرێکی پێشکەوتووتر دەبێت. بەڵام ئەگەر کارەکەت هەر لەسەر سێ چەپکە گوڵەکەی ئەدۆبی (فۆتۆشۆپ و ئیلسترەیتەر و ئین دیزاین)ـە بە کۆمپیوتەری ڕام ١ گێگا و پرۆسێسەری جۆرایەتی نزمیش کاردەکەن و دەتوانیت بوەستیت تا ئەوکاتەی پارەیەکی باش کۆدەکەیتەوە بۆ کڕینی کۆمپیوتەرێکی نایبەتمەند بەرز.

ئێستا کاتی ئەوەیە بێینە سەر ئەوەی کە ئایا پێویستە چی بکەیت وەکو گرافیک دیزایینەر.

## ١- گرافیک دیزایینەر پێویستە پۆرتفۆلیۆی تایبەتی خۆی هەبێت!




**پۆرتفۆلیۆ چیی یە؟** شوێنێکە بۆ نمایشکردنی کارەکانت جا چ وێبگەیەک بێت یان هەبوونی هەژمارێک لە بیهانس کە وێبگەیەکی تایبەتە بە بواری دیزایین بەگشتی یان پەڕەیەکی فەیسبووک یان هەر شوێنێک کە بە ئاسانی خەڵکی بتوانن کارەکانت ببینن. پێم وایە پۆرتفۆلیۆ ئەو شتەیە کە وادەکات بە ئاسانی کار بدۆزیتەوە جا بۆ کۆمپانیای تایبەت بە بواری دیزایین بێت یان وەکو تاک لایەن بۆ لایەنێک کارەکە بکەیت لەبەر ئەوە هەمیشە پۆرتفۆلۆکەت بە بەڕۆژکراوی (Updated) بهێڵەوە و دوایین کارەکانت لەوێ نمایش بکە تا دەکرێت لەگەڵ خەڵکی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و تۆڕە تایبەتییەکان بەو بوارە هاوبەشی پێ بکە و بڵاوی بکەوە .لەڕاستیدا پۆرتفۆلۆکەت ئەو شوێنەیە کە وادەکات بە ئاسانی کار بدۆزیتەوە و لەلایەن کۆمپانیا و دامەزراوەکان داوابکرێت وەکو فەرمانبەر کاریان بۆ بکەیت. هەمیشەش گەواهی کڕیار و خاوەنکارەکان بڵاوبکەوە کەوا چۆن کارەکانی تۆیان بەرزنرخاندووە ئەمەش لەپێناو سەرەنج ڕاکێشانی خەڵکانی تر بۆ لای خۆت.

## ٢- لەدوای هەبوونی پۆرتفۆلیۆ تۆ پێویستە کارامەیی و لێهاتوویت لە دیزایین هەبێت!




پێویستە گرافیک دیزایینەران چاوێکی تیژ و بۆچونێکی داهێنەرانەیان هەبێت. مەبەست لەمە ئەوەیە کە دەبێت تۆ وەکو گرافیک دیزایینەرێک گرنگی بەخۆت بدەیت و توانستی کارکردنت لەگەڵ ڕەنگ و کارە گرافیکیەکانت بەرزبکەیتەوە و باشتر بکەیت و هەر لەسەرەتای کارکردنت وەکو گرافیک دیزایینەر خۆت بێ ورە نەکەیت و بڵێی ئەم ئیشە بەمن ناکرێت کوا من وەکو فلان دیزایینەر دەتوانم شتێکی وا جوان بکەم؟ بەڵام بیرت بێت ئەوەی من و دەیانی تری وەکو منیش دەیزانن و سەلیقەی باشیان هەیە لە گرافیک دیزایین هەر وەکو تۆ بوونە و گەیشتوونەتە ئەمڕۆ کەواتە دەستی لێ هەڵماڵە و چاوەکانت لەگەڵ ڕەنگەکان ڕابهێنە و کار لەدوای کار هەوڵبدە یاری لەگەڵ ڕەنگەکان بکەیت! بۆ باشتر و چاکترکردنی لێهاتوویت ئەوا دەتوانی

پەرتووکی Six Thinking Hats بخوێنیتەوە کە هی نوسەری بەناوبانگ ئێدوارد دی بۆنۆیە و لەلایەن زۆربەی شارەزایانی بواری دیزایین پێشنیار کراوە کە بخوێندرێتەوە کە لەڕاستیدا منیش وەکو خۆم نەم خوێندۆتەوە بەڵام بەهۆی ئەوەی زۆر پێشنیارکراوە پشتیوان بەخوا لەداهاتوودا دەیخونمەوە و هەوڵدەدەم سودی خۆمی لێ وەربگرم! ئێوەش دەتوانن لەم بەستەرەی خوارەوە پەرتوکەکە دابگرن کە بە زمانی ئینگلیزییە:

(Edward_de_Bono]_six_thinking_hats(kitn.net)

بیرمان بێت بوون بە گرافیک دیزایینەر بەدەر لەوەی پیشەیەکە ئەوا ڕێگایەکی سەربەخۆی ژیانە بە واتایەک کە گرافیک دیزایینەران بیرمەندی دیدەنین و تەواوی جەختیان لەسەر بیناییانە کەواتە هەرکات کە بوویتە گرافیک دیزایینەر ئەوا بۆت دەردەکەوێت چۆن و لەکوێ بیرۆکەکانت دەست دەکەوێت جاری واهەبووە کە لە شتانێکی زۆر سەیر و نەگونجاو بیرۆکەم بۆ هاتووە کە دواجار بەرهەمێکی ناوازەی لێ دەرچووە هەر لەبەر ئەوەشە بە ڕێگایەکی سەربەخۆی ژیان ناوزەند دەکرێت لەلای دیزایینەران.

### ٣- پێویستە زمانی قسەکردنی ئەدۆبیت هەبێت!




لەوەیە لەلات سەیربێت کە ئایا مەبەست لە زمانی قسەکردنی ئەدۆبی چییە؟ بەڵێ تۆ ئەگەر توانای وێنەکێشانت هەبێت یان نا ئەوا پێویستە فێری چەند بەرنامەیەکی دیاریکراوی دیزایین ببیت و بتوانیت بەکاریان بهێنیت. بەرنامەکانی ئەدۆبیش باشترینن و باوترینن لەنێوان دیزایینەراندا و لەهەمان کاتیشدا زۆرترین سەرچاوەی فێربوونیان لەسەر بەردەستە و فێرخوازی دیزایین دەتوانێت بە ئاسانی دەستیان بخات و یوتیوب و ڤیمیۆ باشترین سەرچاوەی خۆڕایین! بیرت بێت تەنها فۆتۆشۆپ چارەسەری کارت ناکات بەلایەنی کەمەوە پێویستە لە فۆتۆشۆپ و ئیلسترەیتەر و ئیندیزاین ڕەوان و شارەزابیت. چونکە هەروەکو هەموو دیزایینەرێک دەزانێت کە ئیلسترەیتەر ئەوەیە کە لۆگۆی پێ دیزایین دەکرێت و کاری ڤێکتەر دیزاینی پێ دەکەین وەکو دیزایینەر بەڵام هەرچی فۆتۆشۆپە ئەوە بۆ دەستکاری کردنی وێنە و بابەتی دیزایینی وێبە و ئیندیزاینیش بۆ بابەتی چاپەمەنییە! ئەمە هەرچەندە دەیان خەڵک دەڵێن ئاساییە بروشۆرێک یان لۆگۆیەک بە فۆتۆشۆپ دیزایین بکەیت بەڵام ئێمەی گرافیک دیزایینەران دەڵێین نەخێر بەڵکو هەریەکە و بە بەرنامەی تایبەت بە کارەکەی خۆی دەکرێت!

## ٤- پێویستە تایبەتمەندیەتی خۆت وەرگریت.



وەکو پێشتریش ئامەژەم پێدا پێویستە فێربیت و راهێنان بکەیت و ئەزموون وەرگریت بۆئەوەی باشبیت لەوەی دەیکەیت. هەروەکو بەسەر زۆربەماندا هاتووە لەوانەیە لەسەرەتادا دەیان بواری جیاجیای گرافیک دیزایین تاقیبکەینەوە و گەشت بکەین بەناو تاکە تاکەیاندا بۆ نمونە لەوەیە تۆ ئەزموون و تاقیکردنەوە لەگەڵ دیزایینی چاپ و لۆگۆ بکەیت ئەمە دەبینیت دوای ماوەیەک ژینگە گونجاوەکەی خۆت دەدۆزیتەوە و دەبینیت لەڕاستیدا ژینگەی تۆ بریتییە لە دیزایینی وێب. من پێم وایە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت گرنگە تایبەتمەندی لە بوارێکی دیاریکراوی ناو گرافیک دیزایین وەربگریت چونکە بۆ خۆت گرنگە ئەمە. وەکو لەسەرەوە ئاماژەم پێدا بە هەبوونی پۆرتفۆلیۆیەک کە ماڵپەڕێکی کەسی باشترین نمونەیە ئەوا تۆ دەتوانیت چەندین کڕیار بۆ ئەو بوارە دیاریکراوەی کاری تێدادەکەیت بدۆزیتەوە و ئەمەش بە واتای ئەوە نایەت کە تۆ بوەستیت لە تاقیکردنەوەی بوارەکانی تری ناو گرافیک دیزایین بەڵکو دوای ئەوەی ژمارەیەک لە کڕیارت بۆخۆت پەیداکرد ئەوا ئەوکات دەرگات واڵاکردووە بۆ خۆت بۆ ئەوەی بتوانیت بە ئارەزووی خۆت گەشت بکەیت بەناو بوارەکانی تر و تاقیان بکەیتەوە و خۆت شارەزابکەیت لەو بوارانەشدا. ئەوەشمان بیرنەچێت کە چەندان دیزایینەر هەیە لەیەک کاتدا لە چەندان بواری ناو گرافیک دیزایین شارەزایە بەڵام ئەو گرافیک دیزایینەرانە بواریان هەبووە و کاتیان بۆ گونجاوبووە و ساڵانێکی زۆریان لەبەردەست بووە بۆ شارەزابوون لەو چەندان بوارانە و گرافیک دیزایینەریشمان هەیە لە چەند بواری بەیەکەوە گرێدراو کاردەکات و سەرکەوتووە. بۆ نمونە خۆم سەرەتای کارەکانم بە شتی سادەوە دەستی پێکرد و دیزایینی شتی چکۆڵەم دەکرد و دواتر تەشەنەی سەند بۆ دروستکردنی لۆگۆ و دواتر دیزایینکردنی بەرگ و پاشان گەشەی سەند بۆ گرافیکی جوڵاو ناسراو بە مۆشن گرافیکس و ئیدی دواتر هەوڵمدا لە مۆشن گرافیک بمێنەوە و لەپاڵیشییەوە گرنگی بە دیزایینی بەرگ و لۆگۆ و براندینگ و پۆستەر و بابەتە چاپەمەنییەکان ..هتد بدەم. هەواڵی خۆش ئەوەیە کە زۆربەی بوارەکانی ناو گرافیک دیزایین بەیەکەوە گرێدراون و وادەکات دیزایینەر لە زۆر بوار شارەزایی پەیدابکات.

دوا شت کە بیرت نەچێت وەکو دیزایینەر ئەوەیە کە تۆ وەکو ئارەزووێک ئەوە ناکەیت بەڵکو وەکو کار ئەوە دەکەیت و لەبەر ئەوە ناچاردەبیت بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر یەک بوار بمێنیتەوە و جەخت زیاتر لەسەر ئەو بکەیت. کە ئەمەش بە هیچ شێوەیەک ئەوە ناگەیەنێت تۆ سنوردارکرابیت لە سەردانکردن و ئەزموون وەرگرتن لەوانی تر لەدوایی دا!

ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر کە پێویستە لێرە باس بکرێت ئەوەیە لەم دواییانەدا پیشەی گرافیک دیزایین زۆر پێویست بووە و بەتایبەتیش لە جیهانی دیجیتاڵی و دیدەنی ئەمرۆماندا کە هەر یەکە تێدەکۆشێت بۆ سەرەنج ڕاکێشانی ئەوی تر و ئێمەی دیزایینەریش کەوتویینە ئەو ناوەندەوە و براوەش ئەو کەسە

نییە کە کارەکەی بە دەنگی بەرز هاوار بکات بەڵکو براوە ئەو کەسەیە کەوا دەزانێت چی دەڵێت و کەی و چۆن دەیڵێت ئەمەش بۆ ئەوەی تۆ بیرت بێتەوە و تێبینی بکەیت کە یەکێک دەیەوێت سەرەنجت ڕابکێشێت بێ ئەوەی تۆ تێبینیت کردبێت ئەوەش ئەو ناوەندەیە کە ئێمەی دیزایینەری تێکەوتووین و هەر لەبەر ئەمەشە ئێمە بەرنرخین!

**بوارە جیاجیاکانی گرافیک دیزایین:**

ئەگەر بەردەوامیت لە خوێندنەوەی ئەم بابەتە ئەوە بەدڵنییاوە ئەرکت کێشا و ماندووبوویت. ئەگەر سەرەنجتان دابێت تیشکم خستە سەر زۆر شت و وەڵامی چەندان پرسیارم دایەوە و باسەکەم بەوە قوڵکردەوە چۆن دەبیتە گرافیک دیزایینەر و گرافیک دیزایینەر چ کارەیە و چەندان شتی تر. دوا شت مابێت باسی بکەین بوارە جیاجیاکانی گرافیک دیزایینە کە بەشێکی ناونیشانی بابەتەکەمانە ئەمەش لەبەر ئەوەی تەنها یەک بوار نییە گرافیک دیزایین بەڵکو زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕان دەکرێت.

**لەڕاستیدا ئێمەی گرافیک دیزایینەر بە تەن کار دەکەین و لەوانە نییە بتوانم گشت بوارەکان لێرە بخەمە ڕوو بەڵکو ئەمانە دەخەمەڕوو کە باوترینیان و باشترینن بۆ دەستخستنی کار و پیشەیەک.**

- Creative Director ئەم کەسە بەڕێوەبەرایەتی تیمێک کە دیزایینی دیدەنی بۆ بەرهەمەکان و کەمپینی ڕیکلام و ....هتد دروست دەکەن دەکات.
- Art Director ئەم کەسە بەڕێوەبەرایەتی کردن و هاوکاری کردنی نێوان هونەرمەندە بەرهەمهێنەرانەکان و نەخشەکێشەکانە بۆ دڵنییایکردنەوە لە تەواوکردنی کارەکان لە کاتی خۆیدا و بەدڵبوونیان لەلایەن کڕیارانەوە.
Art Production Manager ئەم کەسە لە ڕووی بەرهەمهێنان و دروستکردنی هونەری بە جەخت کردن لەسەر ئاست بەرزی و کەمکردنەوەی نرخەکان ڕۆڵ دەگێڕێت.
- Package Designer ئەم کەسە هەڵدەستێت بە دروستکردنی بوخچە بۆ بازاڕکردن و بەرهەمەکان لە هەردوو ڕووی دیزایین و دروستکردنی لاشەییەوە.
- Brand Identity Developer ئەم کەسە هەڵدەستێت بە گەشەدان بە دروستکردنی ناسنامە بۆ بەرهەم و ڕێکخراو و کۆمپانیاکان ...هتد
- Visual Image Developer تۆ وێنە و دیزایین دروست دەکەیت لە ڕێگەی مۆدێلی ٣ دووری و فۆتۆگرافی و دەستکاری کردنی وێنە.
- Visual Journalist تۆ هەڵدەستیت بە دروستکردنی زانیارییە گرافیک جا چ بۆ چاپ بێت یان دیجیتاڵی بێت.
- Broadcast Designer تۆ هەڵدەستیت بە دروستکردنی دیزایینی دیدەنی بۆ ئەوەی لە تەلەڤیزیۆن بەکاربهێندرێت.
- Logo Designer تۆ هەڵدەستیت بە دروستکردنی دەربڕینی دیدەنی بۆ کلیلە پەیامی ڕێکخراو و کۆمپانیا و دامەزراوەکان بە واتایەکی تر دیزایین کردنی لۆگۆیەک کە ناوەڕۆکی ئەو کۆمپانیا و ڕێکخراو و دامەزراوەیە هەڵبگرێت.

- Interface Designer تۆ هەڵدەستیت بە دروستكردنی گرافیكی ڕووكاری و ئەمەش زیاتر بەستراوەتەوە بە بابەتی وێب دیزایین.
- Illustrator ئەمە بەستراوەتەوە بە كێشانی وێنە و نەخشە بۆ نواندنی پەیامێك یان چیرۆكێك یان بیرۆكەیەك لە ڕێگەی وێنەی ٢ ڕەهەندی و ٣ ڕەهەندی.
- Web Designerتۆ گرافیك و پەڕە و نەخشەی وێبسایتێك دروست دەكەیت.
- Multimedia Developer تۆ هەڵدەستیت بە جێبەجێكردنی كاری گرافیكی لەسەر دەنگ و جوڵە!
- Content Developer تۆ میدیای نوسرا و گرافیكی و ڤیدیۆیی و دەنگی دروست دەكەیت بەگوێرەی وەسفی كارەكات.

ئێستا كاتی ئەوەیە بڕیار بدەیت و قوڵی لێ هەڵكەیت و كار بكەیت بۆ ئەوەی ببیتە گرافیك دیزایینەر و تایبەتمەندی خۆت لە یەكێك لەو بوارانەی سەرەوە وەرگریت.

**لە كۆتاییدا هیوام وایە گشت لایەك سودمەند بووبن و سودتتان لە بابەتەكە وەرگرتبێت. ئینجا بیرتان نەچێت و هەریەكە لە شوێنی خۆیەوە بابەتەكە بڵاوبكاتەوە و لەگەڵ هاوڕێیان هاوبەشی پێ بكات.**

نوسینی سەردار عبدالله

بەڕێوەبەری گشتی ماڵپەڕ

گرافیك دیزایینەر

www.kitn.net

www.facebook.com/sardaren